68

پرۆژەی تیشك

# دیفاعێك لە خوێندن لە حوجرەكانی كوردستاندا

## وەڵامێك بۆ حەمە كەریم هەورامی



محمد علي قەرەداغی
ئەندامی كاری ئەكادیمیای كوردی

# دیفاعێک لە خوێندن
# لە حوجرەکانی کوردستاندا

★ ناوی پەڕاو : دیفاعێك لە خوێندن لە حوجرەكانی كوردستاندا

★ نووسینی : محمەدعەلی قەرەداغی

★ چاپ و دیزاین : ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

★ تیراژ : ۱۰۰۰ دانە

★ نۆبەی چاپ : یەكەم

★ ژمارەی سپاردن : ۲٦۲۹ ی ساڵی ۲۰۰۹ ی دراوەتێ


٤٠٠٠

## ڕوونکردنەوەیەك:

مامۆستا حەمەکەریم هەورامی کتێبێکی نووسیوە بە ناونیشانی: "مێژووی پەروەردەو خوێندن لە حوجرەکانی کوردستاندا"[1] ئەگەر ئینصاف بەکار بهێنرایەت دەبوو ئەم کتێبە تەرخان بکرایەت بۆ دەرخستنی ڕووی زێڕینی خوێندن لە حوجرەکانی کوردستاندا و بایەخدانی صەدان ساڵی خەڵکی کوردستان بەو سەرچاوە تاك و بێوێنە، کە بە درێژایی مێژوویەکی زۆر تاکە سەرچاوەی ڕۆشنبیری گەلی کورد بووە و، ئەگەر حوجرە و مەدرەسەو مزگەوت نەبوایە لەوانە بوو لەناو گەلی کوردا خوێندەوار لە پەنجەکانی دەستێك تێنەپەڕیایەن. بەڵام بەداخەوە ئەم کتێبە سەرانسەری بۆ شێواندنی ئەو مێژووە و ناشیرینکردنی حوجرەو مەدرەسەو کەمبایەخکردنی دەوری حوجرە لە گەشەپێدانی ڕۆشنبیری کورددا تەرخان کراوە.

ئەمەم زۆر بەلاوە بێ ویژدانی بوو، بێدەنگبوونیش لە ئاستی ئەم نووسینەدا بێدەنگبوونە لە ئاستی شێواندنی لایەکی زۆر گەش و زێڕینی مێژووی کورددا، بۆیە وەڵامێکی کورتی ئەو کتێبەم بە وتارێك دایەوە و ناردم بۆ گۆڤاری (هەفتانە) دوای ئەوەی تایپیشیان کرد بڵاویان نەکردەوە. دوایی ناردم بۆ گۆڤاری (چرای ڕووناکی ) کەچی بە هەڵەی زۆرەوە بڵاویان کردەوە.

خێرخوایەك پێشنیاری ئەوەی کرد لەسەر ئەرکی خۆی ئەم بابەتە بەشێوەیەکی باش بڵاو بکاتەوە. منیش پێشنیارەکەیم پەسەند کردو دوای ئەوەی دەستێکم پێدا هێنایەوە مۆڵەتی ئەوەم پێدا بڵاوی بکاتەوە.

---

[1] - ئەم کتێبە ساڵی ۲۰۰۸ لە لایەنی وەزارەتی ڕۆشنبیری بەڕێوەبەرایەتی گشتیی ڕۆژنامەنووسی و چاپکردن و بڵاوکردنەوەوە چاپ و بڵاوکراوەتەوە.

تەنها مەبەستیشم دیفاعە لەو حوجرە پیرۆزانەی کوردستان کە بە درێژایی مێژووی ئیسلام لە کوردستاندا تەنها ئەوان چرای رۆشنبیری کورد بوون و بڵێسەی زانست لەوێوە کوردستانی رووناك کردۆتەوە.

## دیفاعێك لە "خوێندن لە حوجرەكانی كوردستاندا"

لەوەتەی دەستمداوەتە نووسینی بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لەرێگەی دەستخەتەكانیانەوە دەمەوێ هەرشتێك پێوەندی بە باتەكەوە هەیە هەواڵی بزانم و، بەشوێن زانیاریی نوێ و نەبیسترا و لەو بوارەدا دەگەڕێم و، دەومەوێ ـ تا پێمبكرێت ـ بابەتەكە دەوڵەمەند و دەوڵەمەند تر بكەم.

لەسەرەتای ئەو پرۆژەیەشەوە كورتەباسێكم لەسەر حوجرە و فەقێ و ژیانی فەقێیانی كوردستان نووسیی و، لە هەوڵی ئەوەشدا بووم بۆ چاپی نوێی ئەو باسە شتی تازە كۆبكەمەوە و هەرچیم بواردوە و نەمبیستوە و دەستم پێینەگەیشتوە بیخەمە سەر باسەكە. كاتێك مامۆستا حەمەكەریم هەورامی ـ لەگەڵ سوپاسیدا ـ بەرگی یەكەمی "مێژووی پەروەردە و خوێندن لە حوجرەكانی كوردستاندا"ی بۆ ناردم و ناونیشانەكەیم بینی، وتم: ئەمە ئەوەیە من بۆی دەگەڕێم، لەوانەیە بەشێكی ئەرك و بارەكەی لەسەر شانی من لابردبێ. بۆیە دەستم لەگەڵێ كار هەڵگرت و دەستمدایە ئەو كتێبە و شانم لەخوێندنەوەی شلكرد.

بەڵێ بینیم مامۆستا حەمەكەریم خۆی بەكارەكەیەوە ماندوو كردوە و، گەلێ سەرچاوەی بەدەستهێناوە و زۆری كتێب خوێندۆتەوە، زیاد لەوانەیش مامۆستا حەمەكەریم خۆی لەناوچەی هەورامان و نزیكی مەدرەسەكانی تەوێڵەو بیاردا گەورە بوە و، سەردەمی زێڕینی مەدرەسەی بیارە ـ ئەوكاتە مامۆستا مەلا عبدولكەریمی مودەڕیس لەوێ مامۆستا بوو ـ ی بینیوە و، لە نزیكەوە شارەزایی گەلێ داب و نەریتی خوێندنی حوجرە و ، ژیانی فەقێ و، هەڵسوكەوتی رۆژانەیان و، راتبە و جومعانە و دەقنە و، ئیجازە وەرگرتن و، مەلایەتی و... چی پێوەندی بەو لایەنانەوە هەیە بەچاوی خۆی دیوە و، لەتەك گەلێ بۆنە و دیدار و دیمانەی ئەو ژیانە و رەوشی حوجرەدا ئاشنا بووە... ئەمانەیش سەرجەم كەرەسەیەكی پوخت و پێویستن بۆ

کەسێك بیەوێ لەسەر بابەتی خوێندنی حوجرە بنووسێت و لێکۆڵینەوەی ورد لەسەر لایەنە جۆراو جۆرەکانی بکات.

مامۆستا حەمەکەریم ئەم کەرەستەی لەدەستدابوە و سەرچاوەی زۆریشی خستۆتە پاڵ ئەو کەرەستانە، ئەوسا بابەتەکەی نووسیوە، بەڵام بەداخەوە وەك لەکەسێکی وا چاوەڕوان دەکرێت وا بابەتەکەی نەنووسیوە و، لە گەلێ جێگەدا یان مەبەستی نەپێکاوە، یان ـ سا بەئارەزوو یان بە هەڵە ـ لەمەبەست لایداوە و، حوکمی ناڕەوای بەسەر چەند لایەنی ئەو بابەتەدا داوە کە ماوەیەکی زۆری لەکات و توانای خۆی بۆ تەرخان کردووە. حوکمگەلێك کە وەك پەڵەی رەش و چەورو چڵکن روی کارەکەیان شێواندوە و، نووسینەکەی بایەخی خۆی لەدەستداوە.

سەرەت وایشدەزانم هۆی ئەم کەم و کووڕییە لە نووسینەکەی مامۆستا حەمەکەریمدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە بێلایەنی لە نووسینەکەیدا لەدەستداوە و سۆزو عاتیفەی بۆ ئەو لایەی کە خۆی پەسەندی کردوە، وایکردوە بکەوێتە هەڵەگەلێکی زەق و حاشا هەڵنەگر و ئاشکراوە. هەڵەگەلێك نرخی نووسینەکەیان زۆر کەم کردۆتەوە و، پێویستە تازوە لەپێشدا بەخۆیدا بچێتەوە و، وەك مێژوو نووسێك بەرگی سۆز و عاتیفە لەبەری خۆی دارنێت و بەرگێکی بێگەردی بێلایەنی سەرتاپایی لەبەر خۆی هەڵکێشێت و، ئینجا بەوردی هەنگاو بنێت و لەسەرخۆ بەکارەکەیدا بچێتەوە و لە قاڵبێکی زانستیانەدا دایڕێژێتەوە.

من لەرووی دڵسۆزیمەوە بۆ نووسین و لێکۆڵینەوەی زانستی و لەرووی دڵسۆزیشەوە بۆ رەوشی خوێندنی حوجرە و، کاریگەریی حوجرە لە ژیانی رۆشنبیری جەماوەری کوردستان و گەلێ لای وڵاتانی جیهانیشدا زۆر بەکورتی ـ ئەوەندەی لە شوێنێکی وادا ماوەی هەبێت ـ لا بەلای چەند لایەنێکی هەڵە و لەرێگە لادان و لەراستی دوورکەوتنەوەی مامۆستا حەمەکەریمدا دەکەمەوە بەهیوای راستکردنەوەی هەڵەکان و، خستەنەڕووی باری دروستی ئەو لایەنانە و، لابردنی ئەو پەڵەڕەش و چڵکنانەی کە

بە نووسینەکەی مامۆستا حەمەکەریمەوەن و رووی گەش و شکۆداری مێژووی خوێندنی حوجرەیان لەکەدار کردوە و ، دەستگرتنی مامۆستا حەمەکەریمیش ـ وەك وتم ـ بۆسەر راستە شەقامی لێکۆڵینەوەی دروست و رەسەن.

دەبێ ئەوەیش بڵێم: جگە لەوەی کە نووسیم هیچ مەبەستێکم لە نووسینی ئەم (دیفاعە)دا نیە و، بەپێچەوانەوە حەزم دەکرد ئەم نووسینەی مامۆستا حەمە کەریم لەئاستێکدا بوایە جێگەی سوودی من و کەسانێکیش بوایەت کە دەیانەوێ لەم بوارەدا کار بکەن یان تیایدا شارەزا بن، نەك ببوایەتە هۆی ئەوەی ماوەیەکی کاتی من بگرێت کە پێم خۆش بوو لەشتێکی نوێ و بەسوودتردا بەسەری بەرم.

وەك وتم: لەدەستدانی بێ لایەنی وایکردوە لە مامۆستا حەمە کەریم هەر لەسەرەتاوە پێش ئەوەی بگاتە کۆتایی باسەکەی و ئەنجام بەدەست بهێنێ، بڕیاری خۆی لەسەر ئەوە داوە کە حوجرە بە درێژایی مێژوو هیچ خزمەتێکی بەکلتووری میللەتی کورد نەکردووە و، لەم روەوە نووسیویەتی: "حوجرە لەماوەی مێژوو دوور و درێژی خۆیدا هیچ کات بە هیچ جۆرێ ئاوڕی لە کلتوری میللەتی کورد نەداوەتەوە . ل: ٨"" پێش ئەم بڕیارەیش لە ل: ٧ دا نووسیویە:

"دیارە قوتابخانەیەك نزیکەی نۆ سەدە لەوڵاتێکدا بناغەی داکوتابێ هیچ ناچێتە عەقڵەوە ئەو قوتابخانەیە تایبەتمەندی ئەو وڵاتە یان ئەو کۆمەڵە کە تیابەتی کاری تیا نەکردبێ و نیشانەی تایبەتمەندی خۆی پێ نەبەخشیبێ، هەر لەروانگەی ئەم بۆچوونەوە بوو منی ئەم کارەم خستە سەر ئەستۆی خۆم و بەتاسەوە شانم بۆ شل کرد و دەستم دایە کار".

مامۆستا حەمەکەریم هەورامی ـ وەك بینیمان ـ هەر لەسەرەتای نووسینەکەیەوە هێرشی توندو تیژ دەکاتە سەر رێبازی خوێندنی حوجرە و رۆشنایی و جێگەی خێر و هیوا لەو رێبازەدا ناهێڵێتەوە. منیش لەتەك مامۆستا حەمەکەریمدام بۆ رەخنە و، لام وایە هیچ رێبازێکی ئادەمیزاد نییە لە هەموو روویەکەوە تەواو بێت و جێگەی

رەخنە نەبێت. هەروەها دەیشلێم ـ ئەگەر پێش مامۆستا حەمەکەریم نەبێت ـ من شان بەشانی مامۆستا حەمەکەریم رەخنەم لە رێبازی خوێندنی حوجرە لە هەندێ روویەوە گرتوە و رەخنەکانم دەمێکە تۆمار کردوە و، وایشدەزانم رەخنەکانم رووخێنەر و رووشێنەر نین و، نەمویستووە لەرێگەی ئەو رەخنانەوە خوێندنی حوجرە لە هەموو باشییەك بشۆمەوە.[1]

بەڵام مامۆستا حەمەکەریم ـ وەك وتمان ـ تروسکاییەك ناهێڵێتەوە بۆ ئەوە لە عاستیەوە رێگە بەچاکەیەك و لایەنێکی باش لە لایەنەکانی خوێندنی حوجرە ببرێت و دەڵێت:

"حوجرە لەماوەی مێژووی دوور و درێژی خۆیدا هیچ کات بە هیچ جۆرێ ئاوڕی لە کەلتووری میللەتی کورد نەداوەتەوە".

ئەم نووسینەی مامۆستا حەمەکەریم هێڵێکی راست و چەپ دێنێ بەسەر ـ نەك خوێندنی حوجرەدا ـ هەموو رۆشنبیری گەلی کورددا و، گەلی کورد لەهەموو نەریت و کەلتوورێك دەشواتەوە. چونکە من ئەو پرسیارە دەکەم و، هەموو کەسیش بۆی هەیە هەمان پرسیار بکات: ئایا گەلی کورد بەدرێژایی مێژووی تا چەند ساڵێك لەمەو پێش[2] جگە لەحوجرە سەرچاوەیەکی دیکەی بۆ رۆشنبیری هەبوە؟ وابزانم کەس ناتوانێ حاشا لەوە بکات کە هیچ سەرچاوەیەکی دیکە نەبوە.

جا کە ئەوەمان سەلماند کە سەرچاوەی دیکەمان نەبووە دەبێ بپرسین: ئایا گەلی کورد کەلتووری هەیە؟ مێژووی نوسراوە؟ داب و نەریتی باو باپیری خۆی زانیوە؟ دووبارە کەس ناتوانێ بڵێ: نەء.

---

١- بڕوانە: فی رحاب اقلام و شخصیات کردیە، محمد علی القرداغی، بنکەی ژین، ٢٠٠٧، چاپی یەکەم، ل: ٧.

٢- مەبەستم لە مێژووی کورد دوای هاتنی ئیسلامە، چونکە سەرچاوەی رۆشنبیری و خوێندنی پێش ئیسلاممان بە روونیی نەنووسراوە و نەزانراوە.

ئەی کەواتە کێ داب و نەریت و کەلتووری تۆمار کردووین؟ ئا لێرەوە ڕەخنەکانی مامۆستا حەمەکەریم (هیچ کات بەهیچ جۆرێ...) نادروست دەردەچن و دەبێ پێ لەوە بنێت کە حوجرەکانی کوردستان و مامۆستایانی ئەو حوجرانە پارێزەری کەلتوور و مێژووی کورد بوون و، ئەوان لەشەوەزەنگی سالآنی دێریندا هەلگری مەشخەلی ڕووناکبیری بۆ مداڵ و مێرمنداڵ و چینەکانی دوای ئەوانەی گەلی کورد بوون.

لێرەدا لە مامۆستا حەمەکەریم دەپرسین: ئەحمەدی خانی کە لەڕێگەی مەم و زینەکەیەوە کەلتووری کوردی پاراستوە و، جوانترین نەخشەی بۆ دامەزراندنی دەولەتی کوردی لەسەر بنەمایەکی نەتەوەیی ڕەسەن و پتەو کێشوە، بەجۆرێك ئێستەیش کەسانێك هەن گومانیان لەو نووسینە هەیە و بەگەلی کوردی ڕەوانابینن.. ئەو ڕۆشنبیریەی لەکوێ هێنا؟ لەچ قوتابخانەیەکدا دەرزی خوێند؟ ئایا خانی پەروەردەی حوجرەکانی کوردستان نەبووە؟ مەلای جزیری و، باتەیی و، فەقێ تەیران و، سەودایی و، سەیفیی و چەندین شاعیری دیکەی کورد کە هەلگرو گێڕەرەوەی داب ونەریتی کورد و، نووسەر و داهێنەری داستانەکانی سۆز و عەشق و مەینەتیەکانی گەلی کوردن... لەکوێ خوێندوویانە؟

هەروەها چەند پێیەك وەرە بەملاترەوە و لیستەی ناوی شاعیر و ئەدیبانی کوردی ئەملا بخوێنەرەوە و هەر لەبابا تاهیری هەمەدانییەوە تا دەگەینە سەر صەیدی و، بێسارانی و، مەولەوی و، نالی و، سالم و، کوردی و، وەفایی و، حاجی قادری کۆیی و، مەلای گەورەی کۆیە و... دەیان و دەیان شاعیر و ئەدەیب و زانا ئەوانە لەکوێ خوێندیان؟ لەچ قوتابخانەیەك دەرزی ئەدەب و نیشتیمان پەروەری و ولآت ویستییان خوێند؟ ئایا هەموویان لەناو چوار دیواری قوڕینی حوجرەکانی کوردستاندا بەو هەست و سۆزانە جۆشنەدراون؟

ئەو ڕێبازی خوێندنەی لە کوردستاندا پیادەکراوە و لە حوجرەکاندا پەیڕەوی کراوە لەخۆیەوە دروستنەبووە و، وەك مامۆستا حەمەکەریم خۆی باسی کردووە زانای وەك

خدری کوڕی نەسری کوڕی عوقەیل لە بەغدا خوێندنی تەواوکردووە و ئەو ڕێبازەی بەغدای هێناوەتە کوردستان و خەڵکی کوردستان لەسەری ڕۆیشتوون و حوجرەکانیان پێ ئاوەدانکردۆتەوە.

هەروەها دەبێ ئەویش لەبیرنەکرێت ئەو ڕێبازە ڕێبازێکی شیاو و سەرکەوتووبووە و زانای مەزنی پێگەیاندووە و خوێندەواری باش لەسەر ئەو ڕێبازە فێری خوێندن بوون و هەڵکەوتوون. هەر بۆ بەڵگەی ئەم لایەنەیش دەتوانین بڵێین ئەو زانایانەی لە حوجرەکانی کوردستاندا فێری خوێندن بوون و لای مامۆستایانی کوردستان ئیجازەیان وەرگرتووە، کاتێك لە کوردستان دەرچوون و لە شارە گەورەکانی جیهان و پایتەختە زانستییەکان گیرساونەتەوە، زۆر کەمی پێچووە ئەستێرەیان درەوشاوەتەوە و ناوی زانیارییان دەنگی دواوتەوە و لەڕووی زانستەوە جێگەی باڵا و شیاوی قوتابخانە گەورەکانی جیهان بەڕێزەوە پێشوازییان لێکردوون و پلەی فەتوا و قەزاوەت و حاکمێتی شەرع پێش گەلێ کەس بەوان ڕەوا بینراوە.

ئەگەر لەم ڕووەوە بۆ نموونە بگەڕێین نموونە ئەوەندە زۆرە لێرەدا جێگەی نابێتەوە و دەتوانین باسی ئەوە بکەین چەندین زانای دەرچووی حوجرەکانی کوردستان لە مەککە و مەدینەدا موفتی و مامۆستا و پێشنوێژبوون و بوویانە پێی وتراوە (امام الحرمین) واتە بەرودوا لە هەردوو شوێنەکەدا پێشنوێژ و وتاربێژبووە.[1] خۆ ئەگەر بەرەو قاهیرە و دیمەشق و شوێنەکانی دیش بڕۆین ئەوانیش لەو بەهرە بێبەش نین و چەندین مەدرەسە و شوێنیان بە مامۆستایانی دەرچووی حوجرەکانی کوردستان ئاوەدان بۆتەوە و لاپەڕەکانی مێژووی زانایان بە شانازییەوە سنگی بۆ زۆریان کردۆتەوە. هەر لە

---

١- هەر بۆ نموونە ناوی مامۆستا مەلا سولەیمانی کوردی- یان گەردی- مەدەنی، محەمەدی کوڕی عەبدوڕەسووڵی مەدەنی و، جەعفەری بەرزنجی مەدەنی و، ئیبراهیمی شارانی گۆرانی مەدەنیی و ... چەندین کەسی دیکە لەو کەسە زۆرانەن لەو شوێنە پیرۆزانەدا پێشەوا بوون، ئەوانیش کەسانێکن کە لە حوجرەکانی کوردستان دەرچوون.

بواری باسی خوێندنی ڕەوشی حوجرە و بایەخنەدانی یان بایەخدانی بە کەلتووری کورددا دەکرێ ئەو پرسیارە بکەین:

ئەرێ سەرکردەکانی بزووتنەوەکانی ئازادیخوزانی کورد و هەڵگیرسێنەرانی شۆڕشە یەك لەدوای یەکەکانی گەلی کورد، ئەو سەرکردانەی سڵیان لە پەتی سێدارە نەکردەوە و لە ئاگر و گوللە نەترسان و، ماڵ و گیانیان لە ڕێگەی رزگاری کورد و کوردستاندا بەختکرد.. کێ بوون؟ لە کوێ خوێندبوویان؟ ئایا جگە لە حوجرەکانی کوردستان هیچ سەرچاوەیەکی دیکە هەبوو بۆ ئەو ڕۆشنبیرییە بە گوڕ و گڕ و کڵپەیان کە هەمیشە ئاگری لە هەناوی دوژمن بەرداوە و هەوێن و دەساگیرسێنی شۆڕشە یەك لەدوای یەکەکانی گەلی کوردبوون؟ قازی محەمەد، شێخ سەعیدی پیران، مەلا مستەفای بارزان... کێ بوون؟ لەکوێ خوێندیان؟ جگە لە حوجرەکانی کوردستان سەرچاوەیەکی دی بوو بۆ ڕۆشنبیرییان؟

یەکێکی دی لەو لایەنانەی مامۆستا حەمەکەریم تیایدا بەهەڵەداچووە لایەنی خوێندنی ئافرەت و بایەخنەدان بە ئافرەتانە، لەم ڕووەوە، مامۆستا حەمەکەریم لێرەیشدا حوکمێکی زۆر سەخت و گشتیگری وای داوە پاساوی بۆ نادرێت و وەك ئەوە وایە هیچ ئاگای لە مێژووی خوێندنی کوردستان و ناوی دەیان ئافرەتی ناوداری کورد نەبێت کە لە بوارە جیاجیاکاندا شان بەشانی مامۆستایانی پیاو لە ڕیزی زاناگەورەکانی جیهاندا دانراون.

مامۆستا حەمەکەریم لەم بارەوە نووسیویە:

"... ئەگەر لە شوێنێکدا ژنە قورئانخوێنێنك هەڵکەوتبێ ئەوە بزانە ئەو خوێندنەی دوور لە حوجرە و مزگەوت بەدەستی هێناوە، لە براکانییەوە فێربووە کە خەریکی خوێندن بوون یان کچە مەلا بووە لە ماڵەوە باوکی فێری قورئانخوێندنی کردووە و خوێندەکەشی لە سنووری قورئان بەولاوە تێنەپەڕیوە و تاقانە بووە." ل: ٣٨٩.

یان هەر لە هەمان لاپەڕەدا نووسیویە:

"بەدرێژایی مێژووی پەیدابوونی خوێندن لە (کتاتیب)ەکانی مزگەوتدا رووی نەداوە لە پەنایەکی مزگەوتدا سوختەخانەیەکیش بۆ خوێندنی کچان هەبێ، یان تا ئەمڕۆ من بەرچاوم نەکەوتووە سەرچاوەیەك باس لە مەلایەك بکات ژن بێ و مەلایەتی بۆ ژنان کردبێ." ل: ٣٨٩.

راستکردنەوەی ئەم هەڵەی مامۆستا حەمەکەریم زەحمەتی ناوێت و ئەو کەسەی کەمێك بە لاپەڕەکانی مێژووی ناودارانی کورددا بگەڕێت نەك یەك ئافرەتی (تەنها) قورئانخوێندووی کورد دەیان ئافرەتی مامۆستا وئەدیب و شاعیر و نووسەر و خەتخۆش و بلیمەت دەبینێ کە سەرکەوتووی گەلێ بواربوون و زۆریشیان لە بواری خویاندا لە پیاوانیان بردۆتەوە.

خوالێخۆشبوو مامۆستا ئەمین زەکی بەگ لە کۆتایی (مشاهیر الکرد و کردستان)ەکەیەوە باسێکی تایبەتی بڕداوە و سەرباسەکەی بەناوی (ئافرەتە بەناوبانگەکان) رازاندۆتەوە. لەو باسەدا ناوی (٣٣) ئافرەتی کوردی نووسیوە کە شان بەشانی پیاوان لە بوارە جیاجیاکانی زانست و رۆشنبیریدا گەیشتوونەتە پلەگەلێك لە ریزی ناودارانی کورد و جیهاندا ناویان تۆماربکرێت.[١]

ئەگەر بە وردی بە سەرچاوەکانی مێژوودا بگەڕێین زۆر لەوانە زیاترمان دەستدەکەوێت کە مامۆستا ئەمین زەکی نەینووسیون یان نەیبیستبوون، هەر بۆ نموونە دەڵێم: "ناوی مەستوورەی ئەردەلانی (ماە شەرەف خانم) لەناو ئەو ناوانەدا نییە، هەروەها ناوی مەستوورەیەکی دیش کە وابزانم من یەکەم کەس بووم ناویم خستە سەر

١- مشاهیر الکرد و کردستان، تالیف: محمد امین زکی. بنکەی ژین، ٢٠٠٥، ل: ٤٣٥.

لاپەڕەکانی مێژوو ئەویش مەستوورە (سورمەخان)ی رەواندوزییە کە شاعیربووە و شیعری فارسییم لەلایە.[1]

لە دامێنی ئەم خاڵەدا بە مامۆستا حەمەکەریم دەڵێم: نووسەر -هەر نووسەرێك- نابێ هەموو دەرگایەك داخات و بڕیاری ئەوە بدات ئەو هەموو شت دەزانێت و تەنگی زەویی بێنێتەوە یەك و وابزانێت زانیاری و زانست هەر ئەوانەن ئەو دەیانزانێ؛ چونکە وەك دەڵێن: دنیا کۆنە و مەیدان مشك نەیخواردووە، ئافرەتانیش دەست و چاویان نەبەستراوەتەوە، بیر و هۆشیش کلۆم نەکراون.

نووسین بە رەهایی (موتلەقی) حوکمێکی رەوا نییە و دوایی زۆر لەسەر خاوەنەکەی دەکەوێت. کە مامۆستا حەمەکەریم نووسیویە:

"ئەگەر لە شوێنێکدا ژنە قورئانخوێنێك هەڵکەوتبێ ئەوە بزانە ئەو خوێندنەیَ دوور لە حوجرە.... خوێندنەکەیشی لە سنووری قورئان بەولاوە تێنەپەڕیوە و تاقانە بووە." قسەیەکی زۆر گەورەی کردووە و بە یەکەم سەرنجدانی لاپەڕەکانی مێژوو و خوێندنەوەیەکی واقیعی کوردستان، دەردەکەوێت قسەکەی دەدرێتەوە بە ڕوویدا و هیچ وەڵامێکی دروستیشی پێ نییە بۆی.

یان کە هەر دوای ئەو نووسینەی نووسیویە:

"... یان تا ئەمڕۆ من بەرچاوم نەکەوتووە سەرچاوەیەك باس لە مەلایەك بکات ژن بێ و مەلایەتی بۆ ژن کردبێ."

ئەمەیش لە تەك ڕێزی دووبارەمدا بۆ مامۆستا حەمەکەریم.. ئەوە دەگەیەنێ مامۆستا حەمەکەریم مەودای گەڕانی بەسەرچاوەکاندا و خۆئامادەکردنی بۆ باسەکەی و بەدەستهێنانی کەرەستەی پێویست بۆی، زۆر تەسکە و ئاگای لە گەلێ شت نییە.

---

[1] - بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد، محەمەد عەلی قەرەداغی، بەرگی سێیەم، چاپخانەی (الخنساء) بەغدا، ١٤٢١ك - ٢٠٠٠ز چاپی یەکەم، ل:٣١٧.

لەم رووەوە مامۆستا حەمەکریم بۆ سەرچاوەیەکی بندەستی خۆمان رێنومایی دەکەم، کە ئەوەندەی من بزانم دووجار چاپکراوە، ئەو سەرچاوە لەبەردەمی مامۆستا حەمەکەریمدا قوتدەبێتەوە و پێی دەڵێت: کاکی برا کەمێ لەسەرخۆبە و حوکمی بە پەلە مەدە! کە تۆ دەڵێیت: (مەلایەکی ژن نەبووە) یان (لە براکانییەوە فێری بووە کە خەریکی خوێندن بوون) یان (خوێندنەکەشی لە سنوری قورئان بەولاوە تێنەپەڕیوە..) بۆ نەهاتی سەردانێکی من بکەیت تا تووشی هەڵەی وانەبیت و من پێت بڵێم: هەر لەسەردەمێکی کەمی شارێکی وەك سلێمانیدا چەندین حوجرە — کە تۆ پێی دەڵێیت سوختەخانە- هەبووە مامۆستاکانیان ئافرەت بوون، قوتابییەکانیان کچ و کوڕ بوون، بە یەکسانی، بە تێکەڵاویی، لای مەلای ئافرەت قورئان و بابەتەکانی دیشیان خوێدووە. وەرە با ناوی چەند دانەیەك لەو مەلا ئافرەتانەت پێ بڵێم:

٦- حوجرەی مەلا فاتم، ئافرەت بوو، قوتابی کچ و کوڕ بوون، لە دەرگەزێن بەرامبەر مزگەوتی حاجی مەلا رەسووڵ.

٧- حوجرەی مەلا رەعنا، ئافرەت بوو، قوتابیانی لە کچ و کوڕ بوون ، بەرامبەر مزگەوتی شێخ سەلام.

١٠- حوجرەی مەلا خەجێ، ئافرەت بوو، قوتابیانی لە کچ و کوڕ بوون لە گەڕەکی سەرشەقام.

٢٣- حوجرەی مەلا ئامینە، ئافرەت بوو، کچ و کوڕ ، سەرشەقام.

٣٠- حوجرەی ناجیەخان، ئافرەت بوو، دایکی کەریمی تاجرخان لە سەرشەقام.

٣٧- حوجرەی مەلا عاصم، ئافرەت بوو، کانێسکان بەرامبەر ماڵی شێخ لەتیف.[1]

---

١- بڕوانە: شاری سلێمانی، ساڵحی ئەکرەمی رەشە، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم. بەغدا. (دار الحریة للطباعة)، ١٩٨٧ ل:١٣٥.

ئەمە بەشێکن لەو حوجرانەی ئافرەت دەرسی تێداگوتووەتەوە و کچ و کوڕ تیایاندا خوێندویانە. ئەمە بەشێکە لە شارێك لە شارەکانی کوردستان و گومان لەوەدا نییە ئەگەر بە وردیی لە خوێندنی حوجرەی شار و شارۆچکەکان و لادێکانی کوردستان بکۆڵرێتەوە و سەرژمێر بکرێن ناوی دەیان و دەیان مەلای ئافرەت و حوجرەیان تۆماردەکرێت، کە دەبن بە مایەی شانازی بۆ گەلی کورد و بایەخدانیان بە رۆشنبیری نێر و مێ بە یەکسانیی.

هەر لێرەدا —وەك نووسیومە- دەڵێم: من لە لادێیەکی دوور لە شار و ئاوەدانیدا لای حاجی خەجێ قورئانم خەتمکردووە و حاجی خەجێ نە کچە مەلا بور نە برای مەلا بوو، ئەویش تەنها ئافرەتی خوێندەواری ئەو گوندە نەبوو.[١]

هەروەها دەڵێم: ئافرەتمان بووە خەتخۆش بووە، قورئانی پیرۆزی بە جوانترین شێوە نووسیوەتەوە و دواییش داوای لێبوردنی کردوە و نووسیویەتی: "ئەگەر کەموکوڕییەك لە خەتەکەدا هەبوو لێمببوورن، چونکە تەشیم رستووە و بە قاچ بێشکەم راژەندووە و خەریکی نووسینەوەی قورئانی پیرۆزیش بووم.

لە کۆتایی ئەم خاڵەوە دەڵێم: خۆزگە مامۆستا حەمەکەریم هەورامی لەبری ئەو روانینە سنوور تەسکەی بۆ رۆشنبیریی ئافرەتی کورد و بارودۆخی خوێندنی ئافرەتی بنووسیایە و بە وردیی لەسەرخۆ بەشوێن مەڵبەندەکانی رۆشنبیری ئافرەتانی کورددا هەر لە کۆنەوە تا ئەم سەردەمانەی دوایی بگەڕایە بێگومان شتی زۆری دەستدەکەوت و خزمەتێکی گەورەی مێژووی رۆشنبیریی لە کوردستاندا دەکرد.

بەداخەوە مامۆستا حەمەکەریم هەورامیی بەهۆی پاپەندنەبوونی بە رێبازی نووسینی زانستییانەی مێژووەود و، هەوڵدانی بۆ سڕینەوەی مێژووی حوجرە، لە خزمەتکردنی رۆشنبیری کوردیدا خۆی خستۆتە گەلێ هەڵەی وەهاوە کە هەرگیز پاساویان نییە.

---

١- بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد، بەرگی یەکەم، ل: ١١.

له لاپەڕە (٣٤٧)ی کتێبەکەیدا نووسیویە:

"لەناو ئەو هەموو کتێبانەدا کە بڕبڕاگەی پێڕەوەکانی حوجرەی فەقێن یەك رستە نووسینم بە کوردی چاو پێنەکەوتووە."

لێرەدا خوێنەر بۆی هەیە لە مامۆستا حەمەکریم بپرسێ: ئایا تۆ دەزانی (هەموو!) کتێبەکانی بڕبڕاگەی پێڕەوی حوجرەی فەقێ- دیارە کە هەموویان دەستەخەتی کۆنن- چەندن؟ بێگومان نەك مامۆستا حەمەکەریم هیچ کەسێکمان نازانین، چونکە ئەو دەستخەتانە ئەوەندە زۆر و لە بەدبەختی کورددا ئەوەندە پەرتەوازەن- ئەوانەیان کە ماون- لە ژمارە و ژماردن نایەن و لە هەزارن و دەیان هەزاریش تێدەپەڕن.

جا لێرەدا ئەو پرسیارەی دی دێتە پێشەوە: مامۆستا حەمەکەریم تۆ ئەو (هەموو!) دەستخەتەت لە کوێ دی؟ چۆن توانیت حاشیە و کونە قەبد و تەزبیبی هەموویان سەیربکەیت تا ئەو حوکمە گشتگیرە بەو جۆرە بدەیت؟ خۆزگە وەك من بەشێکی کەم لەو دەستخەتانەی حوجرەم دیوە مامۆستا حەمەکەریم دەیدین و بە چاوێکی بێلایەنانەوە دەیخوێندنەوە، تا ئەوسا دەیزانی چ حوکمێکی ناڕەوای بەسەر ئەو هەموو سەربازە نەناسراوەی کاروانی رۆشنبیریی کوردیدا داوە!

دەیان فەقێی ئاوارە و بێکەس و بێناز لە غەریبیدا کە نەیانتوانیوە دەردە دڵی خۆیان بە کەس بڵێن و گرێی خەم و خەفەت و ناسۆریان لای کەس بکەنەوە، گڕ و بڵێسەی سۆز و عیشقیان بۆ یاری دوور یان نزیك و دەستپێنەگەیشتوویان لای کەس بدرکێنن، لە قووڵایی شەوی ئاوارەییدا، لە کاتێکدا خەو لە چاویان تاراوە و تۆراوە، کە حاشیەیەکیان تەواوکردووە بە دوو سێ وشەی چڕو پڕ لە سۆز لە کۆتایی حاشیەکەوە بە وشەی کوردی رەسەن ئەو یادەیان تۆمارکردووە. بۆ نموونە بە مامۆستا

حەمەکەریم دەڵێم: سەیرێکی دەستخەتە نایابەکەی مامۆستا مەلا محەمەدی (عیونی) بەرزنجی بکات،[1] دوای ئەویش سەرێك لە دەستخەتەکەی میرزای شێخانیی بدات.[2]

جگە لە مانیش گەلێ فەقێی ئەدیب و ئەدەبدۆست و شاعیرمان هەبووە لە پەراوێزی کتێبە دەستخەتەکانیانەوە شیعری کوردیی خۆیان یان شاعیرانی کۆن یان هاوچەرخ و هاودەمی خۆیان نووسیوە و دەستخەتەکانیان، جگە لەوە کتێبی دەرزیان بوون کەشکۆڵ یان دیوانی شاعیرانی کوردیش بوون.

لەم جۆرە دەستخەتەیش زۆرمان هەیە و لە خزمەت گەلێکیاندام و بە مامۆستا حەمەکەریم دەڵێم: با سەرێکی دەستخەتی (٧٢١٩م، و) بدات.[3]

هەر بەم بۆنەوە بە مامۆستا حەمەکەریم دەڵێم: ئەگەر دەستت بۆ دەستخەت برد و ویستت بەشێوەیەك لە شێوەکان باسی بکەیت، زۆر بە پارێزەوە و بە دەزنوێژەوە دەستی بدەرێ، زۆر بەرێزەوە بۆی بڕوانە، چونکە دەستخەت وەك یادگاری فەقێ و مەلایانی رۆژگارانی سەخت و دژوار و پڕ لە مەینەتیی و زەحمەتییە. گەنجینەی کەلتوور و ئەدەب و مێژووی کوردە و، لە ئێستەوە هەتا هەتایە سەرچاوەی لەدەستخەت زگاسەنترمان بۆ نووسینی مێژووی کورد دەستناکەوێت و، ئەگەر کەسانی شارەزا و کارامە و بە ئەمەك بە پشوویەکی قوولەوە لێکۆڵینەوەی ورد لەسەر بەشێکی — نەك (هەموو!)- دەستخەتەکانی کوردستان بکەن رووی زێڕینی مێژووی کورد و زانایانی کورد دەردەخەن و شۆڕشێکی نوێ لە مێژووی کورددا بەرپا دەکەن و ئەو کاتەیش بۆ هەموان دەردەکەوێت کە (حوجرە) ئەوە نییە بەو چاوەوە- کە

---

١- بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد بەرگی یەکەم، ل:٢.

٢- بڕوانە: محمد علی القرداغي: نکبة میرزای شیخاني من خلال مخطوطته، جریدة العراق، العدد ٦٥٧، ١٩٧٨/٤/٢٤

٣- ئەم مامۆستا بەرێزە پێش زیاتر لە ٣٥٠ ساڵ لە پەراوێزی کتێبی دەررەکەیەوە بەشێکی زۆر لە دیوانی بێسارانی نووسیوەتەوە. ( بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد، ٢ ,٢٤٧ ).

مامۆستا حەمەکەریم تەماشای کردووە- تەماشای بکرێت و (حوجرە) مایەی شانازیی گەلیَ کورد و رۆشنبیریی جیهانیشە.

### لایەنێکی دیکەی کتێبەکەی مامۆستا حەمەکەریم:

دەکریَ لە چەند لایەنەوە ئەم کتێبە بدرێتە بەر نەشتەری رەخنەو. رووی دروستییو نادروستییو پێکان یان نەپێکانی مەبەست تیایدا یەکالاَبکرێتەوە یەکێك لەو لایەنانە لایەنی ئەکادیمییو وەك پێویست سوود لە سەرچاوە وەرگرتنە.

بۆ باسێکی ئاوەها گەورەو رەگ داچەقیوو بنج رۆچوو لە مێژووی کورددا، دەبوو مامۆستا حەمەکەریم زیاتر دەستی دابگرتایەو باشتر لق و پۆپی لە نووسینەکەی بکردایەتەوە و، قەوارەی کارەکەی لە بایەخی خوێندنی حوجرەوە نزیکبوایەت.

لێرەدا ئاماژە بۆ چەند لایەن دەکەم و هیوادارم مامۆستا حەمەکەریم لە بری ئەو لادان لە راستییو شاردنەوەی بایەخی حوجرە، لە داهاتوودا ئەمانە بەسەر بکاتەوەو ئەو کەلێنانەیان پیَ پڕبکاتەوە و قەرەبووی هەندێك لەو ناتەواوییانەی ناو کتێبەکەی بکاتەوە.

**یەکەم:** مامۆستا حەمەکەریم وا پیشان دەدات کە خدری کوڕی نەسری کوڕی عوقەیل (٤٨٧ك ١٠٨٥ز) یەکەم کەس بووە خوێندنی گەیاندوەتە کوردستان و یەکەم حوجرە بە بۆنەی ئەوەوە بنیاتنراوە. (ل٢٧٨).

بەلاَم کە بگەڕێینەوە بۆ لاپەڕەکانی مێژوو زۆر پێش ئەو مێژووە چەندین زانای گەورەی شارەزووریی لە ولاَتدا هەبوون و ناوبانگیان زۆر شوێنی جیهانی گرتوەتەوەو، شارەزوور ئەوەندەی زانا تێدا بووە لە خۆیَ زیاد بووەو گەیشتوونەتە بەغداو، لەویَ مامۆستای مامۆستایان بوون و دەرزی حەدیث و زانستەکانی دییان لە خوێندنگا بالاَکانی پایتەختی زانستدا فێری خەلَك کردوە. زانای وەکوو ئەبوبەکری کوڕی

ئەحمەدی شارەزووریی ساڵی ٢٩٨ك ٩١٠ز کۆچی دوایی کردوە کە لە بەغدا مامۆستا بوە.[١]

دیارە ئەم شارەزوورییە کە خاوەنی ئەو پلەی زانستە بوە لە خۆیەوە لە بەغدا هەڵنەتۆقیوە. دەبێ لە کوردستاندا مەڵبەندو جێگەی گەورەی زانست هەبوبێت تا ئەو وێنەی ئەوی تیادا پێگەیشتبێ.

دووەم: خۆزگە مامۆستا حەمەکەریم هەوڵی ئەوەی دەدا سەرژمێرێکی ـ ئەوەی لە توانادایەی ـ حوجرەکانی کوردستانی بکردایەت و، بە شوێن ئەوەدا بگەڕایەت ناوی کۆنترین حوجرەی کوردستانی بدۆزیایەتەوە. بێگومان بەمە کارەکەی دەوڵەمەند دەبوو و رووی راستیی بارودۆخی حوجرەکانی کوردستانیشی دەخستە روو. نەك هەر ئەمەیش بەڵکو لایەنێکی پرشنگداری ناوچەی هەورامانەکەی خۆی دەخستە ڕوو کە جێگەی شانازیی میللەتی کوردەو ـ ئەگەر مامۆستا حەمەکەریمیش شانازیی پێوە بکات ـ ئەوە جێگەی شانازیی ئەویش دەبوو کە زێدو زادگای ئەو ئەو شەرەفەی هەیە لە قۆناغێکی زۆر کۆندا مەڵبەندی رووناکبیریی گەورە لەو دەڤەرەدا بوە.

ئەوەی من زانیومە شارۆچکەی تەوێڵە یەکێکە لەو شوێنانەی لە کۆنەوەو لە پتر لە (٥٠٠) ساڵ پێش ئێستەوە حوجرەی تێدا بوەو بنکەی رۆشنبیری بوە.[٢]

هەروەها دەبوو مامۆستا حەمەکەریم هەوڵی ئەوەی بدایە ـ بە پێی توانا ـ ژمارەی حوجرەکانی کوردستان بزانێت. دەبوو هیچ نەبێ بگەڕایەت تا بزانێ حوجرە بەناوبانگ و گەورەکانی کوردستان کامانە بوون.

جگە لەوانەیش لایەنێکی دیکەی پرشنگدارو جێگەی بایەخ و شانازیی هەیە مامۆستا حەمەکەریم بواردوویەتی. مامۆستا حەمەکەریم خۆی لەوە نەداوە بزانێت

---

١- بڕوانە: شهرزور السلیمانیة: المحامی عباس العزاوی، راجعه و علق علیه وقدم له محمدعلی القرەداغی، الطبعة الاولی.١٤٢٠-٢٠٠٠ . ل: ١٤٠.

٢- بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد، بەرگی: ٣/ل١٦٨

خەڵکی کوردستان بە چ چاوێك بۆ حوجرەیان روانیوە. ئەوەی نەخستۆتە روو میرانی کوردستان هەڵوێستیان لە عاستی حوجرەو فەقێدا چۆن بوە.

دەکرا مامۆستا حەمەکەریم بەم لایەنە کتێبەکەی گەلێ دەوڵەمەند و زانستیانە بکردایەت و، چەندین لاپەڕەی زێڕینی لەسەر ئەم باسەو بەناونیشانی (نرخ و بایەخی حوجرە لای خەڵکی کوردستان و، بایەخدانی میرانی کوردستان بە حوجرەو فەقێ)، تۆمار بکردایەت و کتێبەکەی پێ بڕازاندایەتەوە. چونکە ئەم دوو لایەنە لە باسی حوجرەدا لەوانە نیە بۆ هەر کەسێك خۆی لەم بوارە بدات بتوانێ فەرامۆشیان بکات و پشتگوێیان بخات.

لە لایەکەوە خەڵکی کوردستان بە جۆرێك بۆ حوجرەو مزگەوتیان روانیوە، دوای ئەو کارەساتانەی کە بە درێژایی مێژوو بەسەر کوردستاندا هاتوون و گوندەکان خاپوور کراون، ئەو خەڵکە ستەمدیدە کە دەستیان داوەتەوە دروستکردنەوەی گوندەکانیان، ئەگەر لە پێشدا مزگەوت و حوجرەیان دروست نەکردبێتەوە، ئەوە شان بەشانی ماڵەکانی خۆیان و لەوان جوانتر مزگەوت و حوجرەیان دروستکردوەتەوە.

میرانی کوردیش هەرچەند بەپیلانی دوژمنان شەڕوئاژاوە خراوەتە نێوانیان و، بوون بە دەسکەلای دوژمنان بۆ جەنگی خان و مان سووتێن، هەر کات تۆزێك دەرفەتیان بۆ رەخسابێت یەکەم لاکردنەوەیان لە حوجرەو فەقێ و مەلا بوەو، ئەگەر کەمێك سەرنج بدرێت دەبینین میرانی کورد دەیان مەدرەسەی گەورەیان دروستکردوە، چەندین باخ و مەزرایان وەقفی مزگەوت و مەدرەسە کردوە، بە کڕین و فەرماندان بە نووسینەوە کتێب و سەرچاوەی باشیان بۆ مەدرەسە گەورەکان دابینکردوە.

نەك هەر ئەمە بەڵکو گەلێ جار میران خۆیان فەقێ و مەلاو دەرچووی مزگەوت بوون، نەك هەر ئەوەیش، وا بوە میرێکی کورد لە تەك فەرمانداریی و

میرایەتیەکەیدا، هەرکات بۆی هەڵسووڕابێت چوەتە ئەو مەدرەسەی کە خۆی دروستی کردوە، لەوێدا شان بەشانی مامۆستایان ئەمیش دەرزی بە فەقێیان گوترە.[1]

لە سەرنجدانێکی دیکەدا بۆ ڕێبازی نووسینی کتێبەکەی مامۆستا حەمەکەریم خوێنەر ئەوەی لێ ون نابێت کە مامۆستا حەمەکەریم پابەند نەبرە بە ڕێبازی زانستیەوەو، بێ بۆنەو هۆ پلاری ناشیرین و ناڕەوای گرتوەتە ئایینی ئیسلام و قورئانی پیرۆزو بنەماکانی ئیسلام، کە ئەمەیش بێ بەرنامەیی مامۆستا حەمەکەریم لە کتێبەکەیدا پیشان دەدات.

بۆ نموونەی ئەم لایەنەیش یەك دوو دەق وەك خۆی لە کتێبەکەی مامۆستا حەمەکەریم دەگوێزمەوە ئێرە:

"هەندێ کەس بێ لێکدانەوەو بێ بەڵگە دەڵێن موسڵمانان هەر شوێنێکیان غەزای کردبێ لەوێدا مزگەوتیان کردوەتەوە. ڕەنگە مەبەست لەو قسەیاندا تەنیا ئەوە بێ: ئەگەر لە هەر شوێنێکدا (!) مابنەوە لەوێدا شوێنێکیان بۆ نوێژکردنی ئەوانەیان کە نوێژکەر بوونە! دیاری کردبێ و ناوی مزگەوتیان لێ نابێ. ئەوە وابووە دەنا مانای ئەوە نەبوە خۆیان بە مزگەوت دروستکردنەوە خەریك کردبێ چونکە مەبەستی ئەوان لە غەزاکردندا تەنیا داگیرکردن و لەبیربردنەوەی ڕابردووی ئەو کەسانە بوە کە موسڵمان دەبوون!! "٢٧٤

❊ ❊ ❊

" لە لایەن خەڵکیشەوە مەلاو فەقێ بەڕێزەوە تەماشا دەکران و سایەی پایەی خۆیان هەبوە، ئەوان وایان زانیوە فەقێ و مەلا دەرگای (عیلم)یان بۆ کراوەتەوەو فریشتە باڵی خۆیان لەبەر پێیاندا ڕاخستووە! چی لەمە باشتر هەیە.. ئیمامی عەلی وەهای وتووە!

---

١- بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ٤٨/٤.

فەقێش وای دەزانی خەڵك لەو باوەڕەدان، بۆیە بەو چاوە تەماشایان دەکەن، هەردوو لایان ناحەقیان نەبوو وەهەم هەموو شتێ ساز دەکات"!! ل:٣٥٥.

لێرەدا دەبێ ئەوە بە مامۆستا حەمەکەریم بڵێم جگە لەو سوکایەتیکردن بە بیرو باوەڕی موسوڵمانانە: زانیارییەکانت لەق و لۆقن و ئەوە قسەی ئیمامی عەلی نیەو فەرمایشتی پێغەمبەرە -د- کە دەفەرموێ: "وان الملائكة تضع اجنحتها لطالب العلم رضاء بما يطلبه".[1]

※ ※ ※

" حەزدەکەم لێرەدا جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە کە پەروەردەی ئیسلامیی لە مزگەوتدا چۆن لە سەرەتادا سەری هەڵدا بە هەمان جۆرو میتۆدەو مەبەستەوە بێ گۆڕان و دەسکاری گەیشتە وڵاتی ئێمەو تا ئێستایش هەر لەسەر ئەو دەقە ماوەو نەگۆڕدراوە، چونکە خۆی لە ئاڵوگۆڕەکانی ڕۆژگار دوورخستوەتەوەو نەیویستوە لە کەوڵە کۆنەکەی خۆی بێتە دەرەوە، بۆیە ئەوەی لەگەڵ ئەو پەروەردەدا گەورە دەبێ دەستە پاچە دەردەچێ و لە داوێنی کۆمەڵ و دەرەوەی ژیانی هاوچەرخدا دەژی"!! ل:٢٨٢.

※ ※ ※

" تێبینی: ئیجازەدان تەنیا بۆ ئەو فەقێیانە بوو کە خوێندنی دوانزە عیلمەیان تەواو دەکرد. مەرج نەبوو لێیان تێگەیشتبێ یان نا، ..." ل:٤٢٣.

خۆزگە مامۆستا حەمەکەریم بە ئینصافەوە دەچوە خزمەت چەند ئیجازەنامەیەکی کۆن و لێیان ورد دەبوەوە تا بزانێ بە چ ئەمانەتێکەوە ئیجازە بە مەلا دراوەو، مەلا چۆن ئیجازەی وەرگرتوە! تا بیزانیایەت فەقێ چەند مەبەستی بوە زانست فێر ببێ و لە ڕێی زانستدا چەند شوێن و گوندو شارو لای مامۆستایانی پایەبەرز گەڕاوە تا ئیجازەیەکی شیاوو دروست وەربگرێت.

---

١- ئەمە بڕگەیەکە لە حەدیسێکی درێژ ئەبوداودو ترمذیی ریوایەتیان کردوە.

کتێبەکەی مامۆستا حەمەکەریم لە باسی حوجرەو فەقێ و قورئان و ئیسلامدا پڕە لەم جۆرە تەشەرو تانەو لاقرتیکردنە بە ئیسلام و بنەماکانی، کەچی کە باسی خوێندنی گەلان و ئاینانی دی وەك مەسیحیەت و یەهوودیەت و غەیری ئەوانیش دەکات دەم و قەڵەم و زمانێکی دیکەی هەیە.

شتێکی دیکەیش کە لەم کورتە باسەدا دەبێ جێگەی بکرێتەوە ئەودیە مامۆستا حەمەکەریم زۆری ئەم قسانەی دەیانکات بێ بنەماو سەرچاوەن و هەر قسەی خۆین و پشتگیرییەکی ـ ب بە درۆیش بێت ـ بۆ راوبۆچوونەکانی لە کتێب و سەرچاوەگەلێکەوە نەهێنەوە.

ئەوەی بۆ دوا خاڵی ئەم لایەنە شیاوبێت و نابێ بێ ئەوەی قسەی لەسەر بکرێت بەجێ بهێڵرێت ئەوەیە مامۆستا حەمەکەریم لایەنێکی جێگەی بایەخی گەورەی پێ لێ خشاندوەو وەك چەند لایەنێکی دیکەی پێویستی قسەو باس کردوویەتی بە ژێر لێوەوە. مامۆستا حەمەکەریم دەبوو بە چاك یان بە خراپ ـ بەڵام بە بەرنامەو لەبەر رۆشنایی سەرچاوەی دروستدا ـ ئەنجام و بەرو بوومی خوێندنی حوجرەی بخستایەتە روو و ئەوەی روون بکردایەتەوە بە درێژایی صەدان ساڵ و بوونی صەدان و هەزاران حوجرەو مەدرەسەی گەورەو بچووك لە کوردستاندا بەروبوومیان چی بوە؟ کێیان پێ گەیاندوە؟ ئایا ئەو حوجرانە لە تواناياندا بوە زانای گەورەو بلیمەت و پیاوی ناودار لە بوارە جیاجیاکانی زانستدا بەرهەم بهێنن؟ یان هەر ـ وەك ئەو دەڵێت ـ کەسانی دەسەپاچەو دەست سپی و بێ کارە لە حوجرەکانی کوردستاندا پەیدا بوون؟.

من وای بۆ دەچم مامۆستا حەمەکەریم چاوی بەرایی نەهێناوە بۆ ئەم لایەنە بڕوانێت و لەم عاستەدا دەستی گوێی نەکردوە قەڵەم بخاتە سەر کاغەز، چونکە ئەنجامی مێژووی حوجرەکانی کوردستان ئەوەندە پرشنگدارو زێڕینەو ئەوەندە کەڵە زانو پیاوی بلیمەتیان بەرهەم هێناوە، هەرکەسێ دەستیان بۆ بەرێ و بیەوێ باسیان

بکات ناتوانێ چاو لەو ڕاستیە بقووچێنێ و بە ناچاری دەبێ پێ لە ڕاستی بنێ و ئەو لایەنە بخاتە ڕوو.

**گلەییەك لە وەزارەتی ڕۆشنبیری:**

ئەم کتێبە ئەگەر لە لایەنی خودی دانەرەکەیەوەو لەسەر ئەرکی خۆی چاپ بکرایەت هەر نەیسا. بەڵام کە دەزگایەکی گەورەی وەك وەزارەتی ڕۆشنبیریی لە پشتی چاپکردنیەوە بێت و ئەرك و خەرجی لە ئەستۆی خۆی بگرێت و ـ وەك دەڵێن ـ خەڵاتی باشیش بە دانەرەکەی بدات، ئەوە بۆ خۆی کارەساتەو جێگەی پرسیارە.

لەبەر ئەمە وا دەزانم پێویستمان بە دەزگایەك هەیە لە وەزارەتی ڕۆشنبیریی یان لەهەر لایەکی دیدا بێت، ئەرکی ئەوە بێت کتێب و نووسینی نووسەران لە ڕووی ڕێزمان و شیاویی و نەشیاوییەوە هەڵسەنگێنێت و، بەر لە لێشاوی زۆرو بۆر بگرێت و، قۆناغەکانی پێویست و پێویستتر و لەبەرو لەبەرتر بۆ بەرهەمەکان دیاریی بکات و، چی بە دەردی ئەمڕۆی کوردو باری ڕۆشنبیریی کوردیی ناخوات نەخرێتە پێش کاری بەسوودو ڕەسەن و شیاوەوە.

ئەو لیژنە دەبێ وەها بێت لەژێر کاریگەریی هیچ کۆمەڵ و لایەن و بیرو باوەڕێکدا نەبێت. بەڵکو تەنها بەرژەوەندیی گەلی کوردو ڕۆشنبیریی کوردیی لەبەرچاودا بێت و، کار بۆ گەشەپێدانی ئەو لایەنە بکات و بەس.

لێرەیشدا ئەو قسە دێتە پێشەوە: وەزارەتی ڕۆشنبیریی، یان هەر دەزگایەکی دی، بیەوێت یان نەیەوێت گەلی کورد موسوڵمانەو ئەگەر لە صەدا صەد موسوڵمان نەبێت، ئەوا ڕێژەیەکی زۆری و لە صەدا نەوەد بەرەو ژووری موسوڵمانەو، ئەم ڕێژە زۆرە جگە لە فەقێ و مەلاو پیاوانی ئایینی، بەشێکی زۆریان خوێندەوارو ڕۆشنبیرو پیاوی گەورەی وەك دوکتۆرو ئەندازیارو مامۆستاو قوتابیی بە هەموو بەش و ٠تۆرەکانیەوە تێدایە.

دەبێ ئەو وەزارەتە کارێکی وەها نەکات بە سامانی ئەو گەلەو بە بەری رەنجیان هەستی مردووەکانیان لە ئارامگاکانیاندا پێش زیندووەکانیان بڕوشێنێ و بریندارى بکات و، سوکایەتیی بە بیرو راو ئایین و داب و نەریت و کەلتووری صەدان ساڵەیان بکات، چونکە ئەم جۆرە کارانە وەك لەم نووسینە کورتەوە دەرکەوت زۆر دوورن لە واقیع و راستیی و ئەنجامیش جگە لە خزمەتی بیروبۆچوونی نەخۆش و نامۆو ناحەز بە گەلی کورد شتێکیان لێ بەرهەم نایەت.

**دوا وتەم:**

کاتێ تێبینـی و سـەرنجەکانم بـەم چـەند سـەرنجە کورتـە لەسـەر کتێبـی (مێـژووی پەروەردە و خوێندن لـە حوجرەکـانی کوردسـتاندا) دوایـی پێـدێنم دەڵـێم: سـەرنجەکانم لەمانە زیاترن، ئەم نووسـینە کورتـە بـۆ ئـەوە دەشـێت رووی راسـتیی یـان ناڕاسـتیی کارەکەی نووسەری ئەو کتێبە بخاتە روو، بەڵام وەك سەرنجێکی گشتی دەڵـێم: خوێنـەر کە گەشتێکی خێرا بە لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا بکات و لە رواڵەتەکانی نووسـینەکەی مامۆستا حەمەکەریم وردبێتەوە، بیری بۆ لای ئەوە دەچێت مامۆستا حەمەکەریم ئەم کتێبەی بۆ ئەوە نووسیوە هێرش بەرێتە سەر بنەماکانی ئیسلام -ئەگەر پێی بکرێت- و پایەکانی برووخێنێت و بـوونی قورئـان لـە کوردسـتاندا بەشـتێکی نـامۆ دابنێـت و قورئان شیاوی ئەوە نەبێت لە کوردستاندا هیچ خزمەتێك بکرێت و هەرچـی تائێسـتە بۆ کراوە بە زیادە بووە و بە فیڕۆ چووە!

رەنگە من نەتوانم هیچ شتێك بە مامۆستا حەمەکریم - یان هەر نووسـەرێکی دی بڵێم- کەچی دەنووسێ یان چی نانووسێ، ئـەوە هەرکەسـە و خـوای خـۆی و بۆچـوونی خۆی، بەڵام کـە مامۆسـتا حەمەکـەریم نووسـینەکەی بـەناوی "مێـژووی پـەروەردە و خوێنـدن لـە حوجرەکـانی کوردسـتاندا" نـاوزەدکرد کتێبەکـەی دەبـێ بـە بابـەتێکی مێـژوویی و قـاڵبێکی تایبـەتیی دەگرێـت و خوێنـەر لـە چـاوی بابـەتی مێژووییـەوە دەیخوێنێتەوە و لەو رووەوە مامەڵەی لە تەکدا دەکات.

نووسینی بابەتی مێژووییش هەر باس و خواستێك بگرێتەوە، مێـژووی ئـادەمیزاد بێت، مێژووی بیروبۆچوون بێـت، مێـژووی پـەروەردە بێـت، مێـژووی ئایـدۆلۆجیابێت، مێـژووی داروبـەرد و درەخـت و چـیا بێـت... هەرچـی بێـت، بنەمایـەکی تایبـەتی و قانوونێکی جیهانی و رێبازێکی چەسـپاو و دامـەزراوی جیهـانیی هەیـە، نووسـینەکە دەدرێت لە مەحەکی ئەو یاسا جیهانییە و نووسەر چەند تـوانیبێتی پابەنـد بێـت بـەو قانوونەوە بەو پێیە نرخ بۆ کار و نووسینەکەی دادەنرێت.

یەکێك لەو بنەما سەرەکییانە — وەك لەناو ئەم نووسینەیشدا ئاماژەم بۆ کرد — بێلایەنی نووسەرە. واتە نووسەر کە دەستی دایە قەڵەم و کەوتە نووسین — خۆی خاوەنی هەر بیروبۆچوونێك بێت- دەبێت تەنها هەوڵی ئەوە بدات ئەو بابەتەی ئەو دەیەوێ لەسەری بنووسێت چۆنە وەهای بنووسێت، نە رووتووش و جوانکاریی بۆ بکات، نە بیشێوێنێ و قێزەونی بکات.

راستیی نەکا بەژێر لێوەوە، سەرچاوە نەبوێرێ، هیچ شتێك کەم و کورت نەکاتەوە، سۆز و عاتیفە کارنەکاتە سەر قەڵەم و نووسینی..

بۆیە چاوەڕوانی ئەوەیش لە مامۆستا حەمەکریم هەورامی دەکرا و دەکرێت کە لەسەرخۆ، بێلایەنانە، ژیرانە، بەدەستی پڕ و سەرچاوەی پڕ لە زانیاریی سەر بە بابەتەکەیەوە ورد ورد بە پشووی قووڵەوە هەنگاوبنێت و کارێکی وا بکات بۆ خۆیشی و بۆ مێژوویش بمێنێتەوە و مەڵۆیەکی باش و پڕ لە دان و نەژاکاو بخاتە سەر خەرمانی مێژووی بابەتێك لە بابەتەکانی گەلی کورد بە تایبەتیی و شارستانییەت بە گشتی.

**ئەم چرپەیەش:**

حەز دەکەم وەك بیرخستنەوەیەك ئەوەندە بەگوێی مامۆستا حەمەکەریم هەورامیدا کە ـ سەردەمێکی زۆر ناوی (فەقێ حەمەکەریم) بوە ـ بچرپێنم: ئەگەر ژیانی حوجرەو نانە ڕەقەی خێرومەندانی کوردو (بارك الله في جميع مقاصدنا) و دەورکردنەوەو (ئەرێ بابەکەم)ی بەرهەیوان و سەربانی حوجرەو مزگەوت و، راتبەی فەقێ و، جومعانە و، دەقنەو، ڕەددەو، خێرو چاکەو ماست و هێلکەی پیرەژنە پیرۆزەکانی کورد نەبوایەت ئێستە مامۆستا حەمەکەریم هەورامی، حەمەکەریم هەورامی دی دەبوو وەك ئەو هەموو هەورامییەی ناویان ناگاتە سەر لاپەڕەکانی گۆڤارو رۆژنامەکان و، کەس کتێبیان بۆ چاپ ناکات و بێ دەنگ و ناوو نیشان سەردەنێنەوە.

بۆیە وا بە باش دەزانم مامۆستا حەمەکەریم هەورامی سپلە نەبێت و وەفای لەبەرچاوبێت و، ئەگەر ئەو بیەوێ ئەو پێشینەی خۆی لەبیر بەرێتەوە خەڵك و هاوڕێیانی باشیان لەبیرەو ناسرێتەوە، کوردیش فەرموویەتی: (کانییەك ئاوت لێ خواردەوە بەردی تێ فڕێ مەدە)، (ڕێوی لە کونی خۆی هەڵگەڕێتەوە گەڕ دەبێت).



مەدرەسەی بیارە
پێش تێکدانی لەلایەن
رژێمی بەعسەوە

سالّی (١٩٥٠)

www.tishkbooks.com

شوێنی سەرەکی دابەشکردنی کتێبەکانی (تیشک) : کتێبخانەی (وەفایی) – سلێمانی – 07701919360